ناوی كتێب : پەرستاری ئاسانكراو .

بابەت : پزیشكی

ئامادەكردنی : صلاح اسعد احمد گەردی

تایپ : صلاح اسعد احمد

دیزاینی ناوەوە بەرگ : صلاح اسعد احمد

سالی بلاوبونەوە : ٢٠٢٤

ژمارەی لاپەرە : ٩٨

بۆ هەر ڕەخنەوە پێشنیارێك دەتوانن لەڕێگای ئەم ئیمێلەی خوارەی راوبۆچونەكانتان بنێرن

Strong.2002.strong@gmail.com

## پێشەکی

**سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورەو میهرەبان کە توانیم کتێبێکی تریش بنوسم لەژێر ناونیشانی (( پەرستاری ئاسانکراو )) ، ئەم کتێبە بنچینەکانی کاری پەرستاری باس دەکات بە شێوەیەکی زانستی ،. هیوادارم ئەم کتێبەشم سودی هەبێت لە بواری پزیشکی .**

# پێرسێت

# چۆنیەتی پێدانی فلود (( مغەزی )) بە خولەك

یاساکەی بەم شێوەی خوارەوەیە :

$$\frac{\text{Total infusion volume} \times \text{drop factor}}{\text{Time in minutes}} = \text{Drops/minut}$$

دلۆپ / خولەك = ئەنجام

$$\frac{\text{٢٠ دلۆپ} \times \text{ژمارەی ( ml )ی فلودەکە}}{\text{٦٠ خولەك} \times \text{کاتژمێر}}$$

**تێبینی گرنگ**

1 ml = 20 drop واتە ١ سی سی = ٢٠ ( دلۆپ ) قطرة

1 hour = 60 minutes واتە ١ کاتژمێر = ٦٠ خولەك

**نمونە ١** نەخۆشێك سەردانی دكتۆری كردووە ، دكتۆر نۆرمال سەلاینی N/S بۆ نوسیوە كە دەبێت (( ٤٠٠ ml )) وەربگرێ لە ماوەی ٢ كاتژمێر ، چۆن بزانین ئەو فلودە بە ٢ كاتژمێر تەواو ببێت ؟

**وەلام :**

ژمارەی ملەكان فلودەكە = ٤٠٠ ml

١ مل = ٢٠ دلۆپ

كاتژمێر = ٢ كاتژمێر

$$\text{دلۆپ / خولەك ئەنجام} = \frac{\text{٢٠ دلۆپ} \times \text{ژمارەی ( ml ) ی فلودەكە}}{\text{٦٠ خولەك} \times \text{كاتژمێر}}$$

$$\text{دلۆپ / خولەك} = \frac{\text{٢٠ دلۆپ} \times \text{٤٠٠ ml}}{\text{٦٠ خولەك} \times \text{٢ كاتژمێر}} = \frac{٨٠٠٠}{١٢٠} = 66$$

كەواتە لە هەر دەقەیەك دەبێت (( ٦٦ دلۆپ )) قطرة بدرێت بە نەخۆش بە جیهاز اعطاء

**نمونە ٢ :** منداڵێك دوو رۆژە سكچووی هەیە، سەردانی نەخۆشخانەی كردووە ، دكتۆر فلودی ( R/L ) ڕینگەر لاكتەیتی بۆ نوسیوە كە (( **٥٠٠ مل** )) وەربگرێت بە ماوەی (( **٦ كاتژمێر** )) .
چۆن ئەو ڕێژە فلودە بەو كاتە ، بە شێوەیەكی زانستی بدرێت بە منداڵەكە ؟

**وەلام**

ژمارەی ملەكان فلودەكە = ٥٠٠ مل

١ مل = ٢٠ دلۆپ

كاتژمێر = ٦ كاتژمێر

دلۆپ / خولەك ئەنجام = (٢٠ دلۆپ X ژمارەی ( ml ) ی فلودەكە) / (٦٠ خولەك X كاتژمێر)

دلۆپ / خولەك = (٢٠ دلۆپ X ٥٠٠ ml) / (٦٠ خولەك X ٦ كاتژمێر) = ١٠٠٠٠ / ٣٦٠ = ٢٧

كەواتە لە هەر دەقەیەك دەبێت (( ٢٧ دلۆپ )) قطرة بدرێت بە منداڵەكە بە جیهاز اعطاء

# چونیەتی پێدانی فلود (( مغەزی )) بە کاتژمێر

یاساکەی بەم شێوەی خوارەوەیە :

$$\frac{\text{Total infusion volume}}{\text{Total infusion time}} = \text{ml / H}$$

ژمارەی ( ml ) ەکانی کە دکتۆر داوای کردووە
―――――――――――――――― = مل \ کاتژمێر
ئەو کاتەی دکتۆر دیاری دەکات

**نمونە ١:** نەخۆشێك سەردانی نەخۆشخانە دەكات ، دكتۆر فلودی (( G/S )) بۆ دەنوسێت و دەلێیێت كە (( ٥٠٠ مل )) وەربگرێت بە ماوەی (( ٣ كاتژمێر )) .

**وەلام :**

ژمارەی ملەكان فلودەكە = ٥٠٠ مل
كاتژمێر = ٣ كاتژمێر

مل \ كاتژمێر = ژمارەی ( ml ) ەكانی كە دكتۆر داوای كردووە / ئەو كاتەی دكتۆر دیاری دەكات

مل \ كاتژمێر ١٦٦ مل = ٥٠٠ مل / ٣ كاتژمێر

كەواتە دەبێت لە هەر كاتژمێرێكدا (( ١٦٦ مل )) بدرێت بە نەخۆش بە جیهاز اعطاء

**نمونەی ٢ :** کەسێك دەگەیێنرێتە فریاکەوتن کە بە ئاوی گەرم بە ڕێژەی ٥٠ ٪ سوتاوە ، دکتۆر فلودی (( R\L )) ڕینگەر لاکتەیتی بۆ نوسیوە کە (( ٥٠٠ مل )) بە ماوەی (( 2 کاتژمێر )) فلودەکە وەربگرێ . ؟

ژمارەی ملەکان فلودەکە = ٥٠٠ مل

کاتژمێر = 2 کاتژمێر

مل \ کاتژمێر = ژمارەی ( ml ) مەکانی کە دکتۆر داوای کردووە / ئەو کاتەی دکتۆر دیاری دەکات

مل \ کاتژمێر ٢٥٠ مل = ٥٠٠ مل / 2 کاتژمێر

کەواتە دەبێت لە هەر کاتژمێرێکدا (( ٢٥٠ مل )) بدرێت بە نەخۆشەکە بە جیهاز اعطاء

# چۆنیەتی پێدانی خوێن بە خولەك

پێدانی خوێنیش هەروەکو پێدانی (( فلودەکان )) مغەزییەکان هەمـــــان یــــاسـایــان هـەیە ، کە دەتوانرێت بە (( خولەك )) یان بە (( کاتژمێر )) حساب بکرێن ، لێرە باسی یاسا خولەك دەکەین.

تێبینی: ڕێنماییەکان بــــاس لەوە دەکەن کە خوێن پێدان دەبێت (( کاتژمێرێك بۆ دوو کاتژمێر )) بخایەنێت ، وە مەکزیمەم کات (( زۆرترین کات )) (( چوار کاتژمێرە )) ، وە نابێت پێدانی خــوێن زیاتر لە (( چوار کاتژمێر )) بخایەنێت ، چونکە خوێنەکە تێك دەچێت .
کەواتە ئەگەر نەخۆشێك خوێن وەربگرێ وە چوار کاتژمێر تێپەری کرد خوێنەکەی هـــــەر تـەواو نەبوو ، دەبێت خوێنەکە رابگیرێ و فرێ بدرێت ، هیچی تر نەدرێت بە نەخۆش .

یاساکەی بەم شێوەی خوارەوەیە :

$$\frac{\text{Total infusion volume} \times \text{drop factor}}{\text{Time in minutes}} = \text{Drops/minut}$$

[ ژمارەی ( ml )ی بطلة خوێنەکە X ٢٠ دلۆپ ] / [ ٦٠ خولەك X کاتژمێر ] = ئەنجام دلۆپ / خولەك

**نمونە١ :** ئەگەر بطلیَكی خوێن (( ٣٥٠ مل )) ملی تێدا بێت ، بەماوەی (( ٤ كاتژمێر )) بدرێت بە نەخۆش ، دەبێت لە ماوەی (( ١ خولەك )) دا چەند دڵۆپ (( قطرة )) خوێن بدرێت بە نەخۆش؟

**وەلام :**

ژمارەی ملەكان بطلة خوێنەكە = ٣٥٠ مل
١ مل = ٢٠ دڵۆپ
كاتژمێر = ٤ كاتژمێر

$$\frac{\text{Total infusion volume} \times \text{drop factor}}{\text{Time in minutes}} = \text{Drops/minut}$$

دڵۆپ / خولەك = ئەنجام = [ ٢٠ دڵۆپ x ژمارەی ( ml )ی فلودەكە ] / [ ٦٠ خولەك x كاتژمێر ]

دڵۆپ / خولەك = ٢٩ = ٧٠٠٠ / ٢٤٠ = [ ٢٠ دڵۆپ x ٣٥٠ مل ] / [ ٦٠ خولەك x ٤ كاتژمێر ]

بەلام لە پێدانی خوێن لەگەل فلود لێرە ئەم تێبینی یەی بۆ زیاد دەبێت ئەوەیە كە دەبێت لە (( ١٥ خولەكی )) یەكەم تەنها نیوەی ئەو ڕێژەیە بدرێت بە نەخۆش كە دەردەچێت ، لە نمونەكە ٢٩ دلۆپ لەماوەی یەك خولەكدا ، بۆیە نیوەی ٢٩ وەردەگرین كە دەكاتە (( ١٥ )) دڵۆپ دەدەین بە نەخۆش . دوای (( ١٥ خولەك )) ئەوكات دەبێت لە یەك خولەكدا بیكەینەوە (( ٢٩ )) دلۆپ.

## تێبینی زۆر گرنگ

ئەگەر نەخۆشێك پێویستی بە خوێن هەبوو و، بەپێی یاسایەكە وای دادەنێین كە دەبێت نەخۆشەكە لە (( یەك خولەك )) دا ، دەبێت (( ٣٠ drop )) دلۆپ لە خوێن وەربگرێ .

دەبێت لە (( ١٥ خولەكی )) سەرەتادا تەنها نیوەی ئەو رێژەیەی كە بە (( خولەك )) دەرچووە بدرێت بە نەخۆش .

كەواتە نیوەی (( ٣٠ drop )) دەكاتە (( ١٥ drop ))

بۆیە دەبێت لە (( ١٥ خولەكی )) سەرەتادا بۆ هەر خولەكێك (( ١٥ دلۆپ )) لە خوێن بدرێت بە نەخۆش ، ئەو یش هۆكارەكەی ئەوەیە نەوك نەخۆشەكە هەستیاری دووروست بكات بەرامبەر بەو خوێنە یان هەر كێشەیەكی تر كە ئەگەری هەیە دووروست بیت، لەو (( ١٥ خولەكەی )) سەرەتادا بەدەر دەكەوێت .

دووای تێپەرینی (( ١٥ خولەك )) ئەگەر نەخۆشەكە هیچ كێشەی بۆ دووروست نەبوو ، ئەوا خوێنەكە دەكەینەوە بە (( ٣٠ دلۆپ )) خوێن ، بۆ هەر دەقەیەك .

**نمونەی ٢ : نەخۆشێك پێویستی بە بطلیك خوێنە كە بۆی نوسیوە كە بە ماوەی ( ٤ كاتژمێر ) ئەو خوێنە وەربگرێت .**

**وەلام** بطلیَكی خوێن عادەتەن (( 500 ml )) ە

ژمارەی ملەكان بطلة خوینَتكة = ٥٠٠ مل
١ مل = ٢٠ دلۆپ
كاتژمێر = ٤ كاتژمێر

دلۆپ / خولەك = ئەنجام = (٢٠ دلۆپ X ژمارەی ( ml )ی بطلة خوێنەكە) / (٦٠ خولەك X كاتژمێر)

دلۆپ / خولەك = ٤١ = ١٠٠٠٠ / ٢٤٠ = (٢٠ دلۆپ X ٥٠٠ مل) / (٦٠ خولەك X ٤ كاتژمێر)

كەواتە دەبێت لە یەك خولەكدا (( ٤١ دلۆپ لە خوێن )) بدرێت بە نەخۆش .

## بەلام

پێشتر باسمانكرد لە (( ١٥ خولەكی )) سەرەتادا دەبێت نیوەی ئەو ڕێژەی كە بۆمان دەردەچێت بە (( خولەك )) بدرێت بە نەخۆش ، بۆیە دەبێت (( ٢٠ دلۆپ )) لە خوێن بۆ هەر دەقەیەك بدرێت بە نەخۆش لە (( ١٥ خولەكی )) سەرەتادا ،

دووای تێپەرینی (( ١٥ خولەك )) ئەگەر نەخۆشەكە هیچ كێشەی بۆ دوورست نەبوو ئەوكاتە ڕێژەكە دەكەینە (( ٤١ دلۆپ )) لە خوێن بۆ هەر دەقەیەك .

# چۆنیەتی پێدانی خوێن بە کاتژمێر

پێدانی خوێن بە کاتژمێر بەم یاسایەی خوارەوە دەبێت .

$$\frac{\text{Total infusion volume}}{\text{Total infusion time}} = \text{result} \ \text{ml / h}$$

$$\frac{\text{ژمارەی ( ml ) ی بطلة خوێنەکە}}{\text{کاتژمێر}} = \text{ئەنجام} \quad \text{ml / کاتژمێر}$$

**نمونە :** نەخوشێك پیوستی بە (( 500 ml )) خوێن هەیە ، کە بە ماوەی (( ٤ کاتژمێر )) وەربگرێت .

**وەلام :**

$$\frac{\text{ژمارەی ( ml ) ی بطلة خوێنەکە}}{\text{کاتژمێر}} = \text{ئەنجام} \quad \text{ml / کاتژمێر}$$

$$\frac{500 \text{ ml}}{4 \text{ hours}} = 125 \quad \text{ml / h}$$

کەواتە دەبێت لەماوەی (( ١ کاتژمێردا )) ، (( ١٢٥ )) مل لە خوێن وەربگرێت . بەلام وەکو پیشتر باسمان کرد لە ١٥ خولەکی سەرەتادا دەبێت ١٥ دلۆپ لە خوێن بڕوات ، دواتر لە یەك کاتژمێردا ١٢٥ مل لە خوێن بدرێت بە نەخۆش .

# ياسای پێدانی فلود بە (( مايكرۆ درۆپ )) measure volume set

ئەوەی كە لەم ياسايەدا جياوازە لەگەڵ ياسای فلودەكان ئەوەيە كە

**1 m = 60 drop** واتە (( ٦٠ دلۆپ لە مايكرۆ درۆپ = بە ١ مل ))

٦٠ دلۆپ (( قطرة ))
لە مايكرۆ درۆپ
=
١ مل

یاسای فلود بەبەكارهێنانی (( مایكرۆ دڕۆپ ))

$$\frac{\text{Total infusion volume} \times \text{drop factor}}{\text{Time in minutes}} = \text{Drops/minut}$$

دلۆپ / خولەك ئەنجام = ٦٠ دلۆپ X ژمارەی ( ml ) ەكانە فلودەكەی ناو مایكرۆ دڕۆپەكە
٦٠ خولەك X كاتژمێر

**نمونه ١:** مندالێك پیوستی بە (( ١٠٠ مل )) لە نۆرمال سەلاین (( N/S )) هەیە بە کە بە ماوەی (( ٥ کاتژمێر )) تەواو بێت ، دەبێت لە ماوەی (( ١ خولەك )) دا چەند دلۆپی پیٚ بدرێت ؟

**وەلام**

ژمارەی ملەکان ناو مایکرۆ دڕۆپەکە = ١٠٠ مل

١ مل = ٦٠ دلۆپ بە مایکرۆ دڕۆپ

کاتژمێر = ٥ کاتژمێر

دلۆپ / خولەك ئەنجام = ( ٦٠ دلۆپ X ژمارەی ( ml ) ەکانە فلودەکەی ناو مایکرۆ دڕۆپەکە ) / ( ٦٠ خولەك X کاتژمێر )

دلۆپ / خولەك ٢٠ = ٦٠٠٠ / ٣٠٠ = ( ٦٠ دلۆپ X ١٠٠ مل ) / ( ٦٠ خولەك X ٥ کاتژمێر )

کەواتە دەبێت (( ٢٠ دلۆپ )) لە نۆرمال سەلاین بدرێت بە مندالەکە بە ماوەی (( یەك خولەك ))

**نمونە ٢ :** نەخۆشێك سەردانی فریاكەوتن دەكات كە سكچووی هەیە ، دكتۆر پێشنیاری فلودی رینگەر لاكتەیتی R/L بۆ كردووە و كە 150 ML وەربگرێ ، بە ماوەی 3 كاتژمێر . چۆن حیساب دەكرێت كە لە 1خولەك دا چەند دلۆپ لە رینگەر لاكتەیت دەبێ وەربگرێت .

**وەڵام :**

ژمارەی ملەكان ناو مایكرۆ درۆپەكە = ١٥٠ مل
١ مل = ٦٠ دلۆپ بە مایكرۆ درۆپ
كاتژمێر = ٣ كاتژمێر

دلۆپ / خولەك ئەنجام = (٦٠ دلۆپ X ژمارەی ( ml ) مكانە فلودەكەی ناو مایكرۆ درۆپەكە) / (٦٠ خولەك X كاتژمێر)

دلۆپ / خولەك = (٦٠ دلۆپ X ١٥٠ مل) / (٦٠ خولەك X ٣ كاتژمێر) = ٩٠٠٠ / ١٨٠ = ٥٠

كەواتە دەبێت (( ٥٠ دلۆپ )) لە رینگەر لاكتەیت بدرێت بە نەخۆشەكە بە ماوەی ( یەك خولەك)

# چۆنیەتی پێدانی پاراسیتامۆل بوتل paracetamol bottle

چۆنیەتی پێدانی (( paracetamol bottle )) یان (( flagyl bottle )) کە دکتۆر داوای چەند (( ml )) یکی کەم دەکەن کە بدرێت بە مندالان . یاساکەی بەم شێوەی خوارەوەیە .

دلۆپ / خولەک ئەنجام = (۲۰ دلۆپ X ژمارەی ئەو ( ml ) لانەی دکتۆر داوای کردووە) / خولەک

**نمونە :** دکتۆر داوای (( 30 ml )) لە (( paracetamol bottle )) کردووە کە بدرێت بە منداڵێکی (( 2 )) سالان .

**تێبینی :** ئەگەر دکتۆر نەی گوتبوو (( پاراسیتامۆلەکە )) ب چەند خولەک تەواو ببێت ئەوا دەبێت خۆت کات دیاری بکەیت بۆ نمونە ئێمە لەم نمونەیەدا (( ۱۰ خولەک )) مان داناوە .

**وەلام :**

$$\frac{30\ ml \times 20\ drop}{10\ min} = \frac{600\ drop}{10\ min} = 60\ Drop / min$$

کەواتە دەبێت لەماوەی (( ۱ خولەکدا )) (( ٦٠ دلۆپ )) پاراستامۆل بدرێت بە منداڵەکە .

# چۆنیەتی پێدانی دەرزی بە ملیگرام

کاتێك دکتۆر داوا دەکات دەڵێت (( ئەوەندە ملیگرامە mg )) لەم دەرزی یە لە نەخۆش بدە

چۆن دەزانیت کە چەند (( ملیگرام mg )) دەبێت لە نەخۆش بدەیت ؟

بەم یاسایەی خوارەوە دەتوانیت ڕێژەکە دەربێنیت .

$$\frac{\text{Desired dose} \times \text{Stock volume}}{\text{Available dose}} = \text{ئەنجام ml}$$

$$\frac{\text{ئەو mg کە دکتۆر داوای کردووە} \times \text{ئەمپولەکە چەند ml مللە}}{\text{ئەمپولەکە چەند mg ملیگرامە}} = \text{ئەنجام خولەك / دڵۆپ}$$

نمونە ١ : دكتۆر پێشنیاری(( genramici )) ی بۆ نەخۆش كرد كە (( 80mg )) بە ڕێگای (( im )) لە نەخۆش بدرێت ، ئەو ئەمپولەی كە هێناویە یاخود بەردەستە (( 40mg/1 ml )) .
چۆن بزانین كە دەبێت چەند (( ml )) لە نەخۆشەكە بدرێت ؟

وەلام :

ئەو دۆزەی دكتۆر دیاری كردووە = 80 mg
ئەمپولەكە چەند مللە = 1 ml
ئەمپولەكە چەند ملیگرامە = 40 mg

$$\text{ML ئەنجام} = \frac{\text{ئەو mg كە دكتۆر دیاری كردووە} \times \text{ئەمپولەكە چەند ml مللە}}{\text{ئەمپولەكە چەند mg ملیگرامە}}$$

$$\frac{80\ \text{mg} \times 1\ \text{ml}}{40\ \text{mg}} = \frac{80\ \text{ml}}{40} = 2\ \text{ml}$$

كەواتە دەبێت (( 2 mg )) بە (( im )) لە نەخۆش بدرێت .

**نمونه ٢ :** دکتۆر پێشنیاری (( **tramadol** )) ی بۆ نەخۆش کرد کە (( **80mg** )) بە ڕێگای (( **iv** )) لە نەخۆش بدرێت ، ئەو ئەمپولەی کە بەردەستە (( **100mg/2 ml** )) . چۆن بزانین کە دەبێت چەند (( **ml** )) لە نەخۆشەکە بدرێت ؟

**وەلام :**

ئەو دۆزەی دکتۆر دیاری کردووە = 80 mg
ئەمپولەکە چەند مللە = 2 ml
ئەمپولەکە چەند ملیگرامە = 100 mg

$$\frac{\text{ئەو mg کە دکتۆر دیاری کردووە} \times \text{ئەمپولەکە چەند ml مللە}}{\text{ئەمپولەکە چەند mg ملیگرامە}} = \text{ئەنجام ML}$$

$$\frac{80\ \text{mg} \times 2\ \text{ml}}{100\ \text{mg}} = \frac{160\ \text{ml}}{100} = 1.6\ \text{ml}$$

کەواتە دەبێت (( 1.6 ml )) بە (( **iv** )) لە نەخۆش بدرێت .

**نمونە ٣ :** دکتۆر پێشنیاری دەرزی (( cortisone )) ی بۆ نەخۆش کرد کە (( 30mg )) بە ڕێگای (( im )) لە نەخۆش بدرێت ، ئەو ئەمپولەی کە بەردەستە (( 50mg/2 ml )) . چۆن بزانین کە دەبێت چەند (( ml )) لە نەخۆشەکە بدرێت ؟

**وەلام :**

ئەو دۆزەی دکتۆر دیاری کردووە = 30 mg
ئەمپولەکە چەند مللە = 2 ml
ئەمپولەکە چەند مليگرامە = 50 mg

$$\text{ML ئەنجام} = \frac{\text{ئەو mg کە دکتۆر دیاری کردووە} \times \text{ئەمپولەکە چەند مللە ml}}{\text{ئەمپولەکە چەند مليگرامە mg}}$$

$$\frac{30\ \cancel{mg} \times 2\ ml}{50\ \cancel{mg}} = \frac{60\ ml}{50} = 1.2\ ml$$

کەواتە دەبێت (( 1.2 ml )) بە (( iv )) بدرێت بە نەخۆش .

نمونە ٤ : دكتۆر پێشنیاری دەرزی (( morphine )) ی بۆ نەخۆش كرد كە (( 5mg )) بە ڕێگای (( im )) لە نەخۆش بدرێت ، ئەو ئەمپولەی كە بەردەستە (( 15mg/1 ml )) . چۆن بزانین كە دەبێت چەند (( ml )) لە نەخۆشەكە بدرێت ؟

وەلام :

ئەو دۆزەی دكتۆر دیاری كردووە = 5 mg
ئەمپولەكە چەند ml = 1 ml
ئەمپولەكە چەند mg = 15 mg

$$\frac{\text{ئەو mg كە دكتۆر دیاری كردووە} \times \text{ئەمپولەكە چەند ml مللە}}{\text{ئەمپولەكە چەند mg ملیگرامە}} = \text{ئەنجام ML}$$

$$\frac{5\ \text{mg} \times 1\ \text{ml}}{15\ \text{mg}} = \frac{5\ \text{ml}}{15} = 0.3\ \text{ml}$$

كەواتە دەبێت (( 0.3ml )) بە (( im )) بدرێت بە نەخۆش .

نمونە ٥ : ئەمپولێكی (( heparin )) كە (( 5000 units )) وەحدەی تێدایە بۆ هەر (( 5ml ))، وە دكتۆر داوای دەكات كە (( 600 unites )) بدرێت بە نەخۆش ، چۆن بزانرێت كە چەند (( ml )) دەبێت بدرێت بە نەخۆش .

وەلام :

ئەو دۆزەی دكتۆر دیاری كردووە = 600 units
ئەمپولەكە چەند ml = 5 ml
ئەمپولەكە چەند mg = 15 mg

$$\text{ML ئەنجام} = \frac{\text{ئەمپولەكە چەند ml مللە} \times \text{ئەو mg كە دكتۆر دیاری كردووە}}{\text{ئەمپولەكە چەند mg ملیگرامە}}$$

$$\frac{600\ \text{units} \times 5\ \text{ml}}{5000\ \text{units}} = \frac{3000\ \text{ml}}{5000} = 0.6\ \text{ml}$$

كەواتە دەبێت ((0.6ml)) بدرێت بە نەخۆش .

# چۆنیەتی پێدانی حەپ بە mg ملیگرام

چۆنیەتی حسابکردنی (( حەپ و کەپسولەکان )) کاتێك دکتۆر داوا دەکات کە (چەند ملیگرام ) mg بدرێت بە نەخۆش ؟

یاساکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە .

ئەنجام حەپ = ئەو mg کە دکتۆر داوای کردووە ÷ ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg ملیگرامە

چۆنیەتی گۆڕینی (( kg , g , mg , mcg , ng )) جارانی (( ١٠٠٠ )) دەکەین .

وە بە پێچەوانەوە گۆڕینی (( kg , g , mg , mcg , ng )) دابەشی (( ١٠٠٠ )) دەکەین .

**نمونە ١ :** دکتۆر داواى کردووە کە (( 600 mg )) لە حەپی (( ibuprofen )) بدرێت بە نەخۆش ، بەلام ئەو حەپەی بەردەستە (( 150 mg ))ە ، چۆن بزانین کە دەبێت چەند حەپ بخوات کە بکاتە (( 600 mg )) .

**وەلام :**

ئەو mg دکتۆر دیاری کردووە = 600 mg
ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg = 150 mg

ئەنجام حەپ = ئەو mg کە دکتۆر داوای کردووە / ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg ملیگرامە

$$\frac{600\ mg}{150\ mg} = \frac{60\ mg}{15\ mg} = 4$$ حەپ

**نمونە ٢ :** كەپسولی (( erythromycin )) كە (( 500 mg )) ە ، دكتۆر داوای كردووە كە (( 1.5g )) بدرێت بە نەخۆش ، دەبێت چەند كەپسول بدرێت بە نەخۆشەكە ؟

**وەلام :** دكتۆر بە (( g گرام )) داوای كردووە ، وە كەپسولەكەش بە (( mg مليگرامە )) بۆیە سەرەتا دەبێت (( g گرام )) ەكە بگۆڕین بۆ (( mg مليگرام )) بەم شێوەی خوارەوە ، پاشان دەست بە یاساكە بكرێت بۆ شیكاركردن .

1 g = 1000 mg
1.5 g = 1500mg

1.5 g X 1000mg = 1500 mg

ئەو mg دكتۆر دیاری كردووە = 1500 mg
ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg = 500 mg

ئەنجام حەپ = ئەو mg كە دكتۆر داوای كردووە / ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg مليگرامە

$$\frac{1500mg}{500\,mg} = \frac{15}{5} = 3$$ حەپ

**نمونە ٣ :** دکتۆر داوای حەپی (( atenolol )) ی (( 100 mg )) کردووە ، وە داوای کردوو ، بەلام ئەو حەپەی کە لە نەخۆشخانە بەردەستە (( 0.05 g )) دەبێت چەند حەپ بدرێت بە نەخۆشەکە ؟

**وەلام :** وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا سەرەتا دەبێت (( g گرام )) بگۆڕین ب (( mg مليگرام ))

ئەویش بە جارانکردنی (( 1000 )) .

واتە : 0.05g x 1000mg = 50 mg

ئەو mg دکتۆر دیاری کردووە = 100 mg

ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg = 50 mg

$$\text{ئەنجام حەپ} = \frac{\text{ئەو mg کە دکتۆر داوای کردووە}}{\text{ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg مليگرامە}}$$

$$\frac{100mg}{50\ mg} = \frac{100}{50} = 2 \ \text{حەپ}$$

کەواتە دەبێت ٢ حەپ بدرێت بە نەخۆش

**نمونە ٤ :** دكتۆر داوای حەپی (( enalapril )) ی (( 7.5 mg )) كردووە كە بدرێت بە نەخۆش، بەلام ئەو حەپەی كە لە نەخۆشخانە بەردەستە (( 5 mg )) دەبێت چەند حەپ بدرێت بە نەخۆشەكە ؟

**وەلام :**

ئەو mg دكتۆر دیاری كردووە = 7.5 mg

ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg = 5 mg

ئەنجام حەپ = ئەو mg كە دكتۆر داوای كردووە ÷ ئەو حەپەی بەردەستە چەند mg ملیگرامە

$$\frac{7.5\ mg}{5mg} = 1.5$$ حەپ

كەواتە دەبێت 1.5 حەپێك و نیو بدرێت بە نەخۆش

# چۆنیەتی پێدانی ئۆکسجین (( O2 )) بە نەخۆش

بۆ پێدانی ئوکسجین بە نەخۆش سەرەتا دەبێت بە ئامێری (( pulse oximeter )) ڕێژەی ئۆکسجینی نەخۆش بپیورێت و پاشان بەهۆی ئەم یاسایەی خوارەوە ئۆکسجین بدرێت بە نەخۆش .

ئەنجام بە لیتر = ڕێژەی ئۆکسجینی نەخۆش − 100

**پاشان**

لیتر = ئەنجام / 4

**نمونە ١ :** نەخۆشێك ڕێژەی ئۆكسجینی (( 80 L )) پیوستی بە چەند لتر ئۆكسجین هەیە بۆی دابندرێت ؟

**وەلام :**

$$100 - 80 = 20\ L$$

$$\frac{20\ L}{4} = 5\ L$$

كەواتە دەبێت (( 5 L )) لە ئۆكسجین بدرێت بە نەخۆش .

**نمونە 2 :** نەخۆشێك ڕێژەی ئۆكسجینی (( 60 L )) پیوستی بە چەند لتر ئۆكسجین هەیە بۆی دابندرێت ؟

**وەلام :**

$$100 - 60 = 40\ L$$

$$\frac{40\ L}{4} = 10\ L$$

كەواتە دەبێت (( 10 L )) لە ئۆكسجین بدرێت بە نەخۆش .

# چۆنیەتی ئامادەكردنی (( كارپور ))

**كارپور : جۆرێكی لیدۆكاینە (( بەنجە )) بەكاردێت لە نەشتەرگەری (( septo )) و وە لە نەشتەرگەری دەم و ددان ، ئەم لیدۆكاینە (( adrenaline )) لەگەڵدایە بۆ ئەوەی خوێنبەربون كەمتر بێت .**

**كاتێك (( كارپۆر )) لە نەخۆشخانە بەردەست نەبێت ، چۆن بتوانین ئامادەی بكەین .**

**(( 10 unit )) وحدە لە (( adrenaline ))**

**لەگەڵ**

**(( 10 ml )) لە (( Lidocain 2 % ))**

## چۆنیەتی ئامادەکردنی کارپور

سرنجێکی (( ئەنسۆلین )) دێنین (( 10 unite )) وحده لە (( adrenaline )) وەردەگرین ،

وە پاشان بە سرنجێکی (( 10 ml )) ی (( 10 ml )) لە (( لیدوکاین 2 % )) وەردەگرین ، وە ئەو (( 10 unite )) ەی (( adrenaline )) کە بە سرنجی ئەنسۆلین وەرمان گرتبوو ، دەکەینە ناو ئەو (( 10 ml )) ەی (( لیدۆکاین )) .

# چۆنیەتی ئامادەکردنی گلوکۆزی % 10

زۆربەی کات گلوکۆزی 10 % لە نەخۆشخانەکان بەردەست نی یە ، وە زۆر کات بۆ ئەو نەخۆشانەی کە شەکرەیان زۆر دادەبەزێت پیوستییان بە گلوکۆززی 10 % هەیە ، وە زۆربەی کاتیش گلوکۆزی 5 % وە 50% لە نەخۆشخانەکان بەردەستە ، جا بەو دوو گلوکۆزە دەتوانرێت گلوکۆزی 10 % ئامادە بکرێت بەم شێوازەی خوارەوە .

سەرەتا **لە گلوکۆزی 5 %** کە خۆی (( 500 ml )) ، لە (( 50 ml )) ی دەردەهێنین ، دەمێنێتەوە (( 450 ml )) .

وە پاشان **لە گلوکۆزی 50 %** کە ئەویش (( 500 ml )) ، لە (( 50 ml )) ی دەردەهێنین ، بەلام ئەو (( 50 ml )) **داخل** (( لەناو )) ئەو (( 450 ml )) ی **گلوکۆزی ((5 %))** یەکەم دەکەین ، دەبێتە (( 500 ml )) لە **گلوکۆزی (( 10 %))** بەرهەم دێت .

# چونیەتی ئامادەکردنی (( Atrovent nebulizer ))

Atrovent : چارەسەرێکە بەکاردێت بۆ نەخۆشی درێژخایەنی سییەکان ، کە وادەکات نەخۆشەکە بە ئاسانی هەناسە بدات ، وە ئەترۆڤێت وادەکات بۆریەکانی هەوا لە سییەکاندا بکرێنەوە و نەخۆشەکە بە ئاسانی هەناسە بدات . وە بەکاردێت بۆ نەخۆشی درێژخایەنی (( ڕەبۆ ، هەوکردنی بۆڕی هەوا ، ئاوسانی سییەکان ......هند )) .

ئامادەکردنی (( atrovent nebulizer )) بخاخ

بۆ گەوران : (( 1 یان 2 سی سی )) لە (( atrovent )) لەگەل (( 2 یان 3 سی سی )) لە نۆرمال سەلاین تێکەل دەکرێت .

ڕۆژانە تاوەکو (( ٤ جار )) دەتوانرێت بەکاربهێنرێت .

بۆ مندال : (( 1 سی سی )) لە (( atrovent )) لەگەل (( 2 یان 3 سی سی )) لە نۆرمال سەلاین تێکەل دەکرێت .

ڕۆژانە تاوەکو (( ٤ جار )) دەتوانرێت بەکاربهێنرێت .

## چۆنیەتی ئامادەکردنی (( salbutamol nebulizer ))

ئەگەر (( salbutamol 2.5 or 5 mg )) بوو بەم شێوازە ئامادە دەکرێت .

**بۆ گەورە و بۆ منداڵ**

(( 0.5 or 1 ml )) لە (( salbutamol )) لەگەڵ (( 2 or 5 ml )) نۆرماڵ سەلاین تێکەڵ دەکرێت .

ڕۆژانە تاوەکو (( ٤ جار )) دەتوانرێت بەکاربهێنرێت .

## جیاوازی نێوان (( ventolin & atrovent )) چی یە ؟

هەردووکیان یەك کار دەکەن ، ئەویش فراوانکردنی بۆری هەواو بۆریچکەکانی هەوایە بۆ ئەوەی کەسەکە بە ئاسانی بتوانێت هەناسە بدات .

بەڵام (( ventolin )) خێراتر کار دەکاتن وە (( atrovent )) تاخیرتر ئیش دەکات .

وە (( atrovent )) زیاتر بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە نەخۆشی درێژخایەنی سییەکان .

# جۆرەکانی دکتۆر

| جۆرەکانی دکتۆر | پسپۆڕیەکان |
|---|---|
| دکتۆری دل | cardiologist |
| دکتۆری مێشك و دەمار | neorologist |
| دکتۆری پێست | dermatologist |
| دکتۆری ئێسك و ماسولکە | orthopedist |
| دکتۆری تیشك و سۆنار | radiologist |
| دکتۆری مندالان | pediatrician |
| دکتۆری ددان | dentist |
| دکتۆری ئافرەتان | gynecologist |
| دکتۆری مندالی تازە لەدایکبوو | neonatologist |
| دکتۆری سەرەطان | oncologist |
| دکتۆری قورگ و لووت و گوێ | ENT specialist |
| دکتۆری نەشتەرگەر | surgeon |
| دکتۆری میزەرۆ | urologist |
| دکتۆری چاو | optometrist |
| دکتۆری دەروونی | psychiatrist |
| دکتۆری چارەسەری سروشتی | physiologist |
| دکتۆری نەشتەرگەری جوانکاری | Plastic surgeon |
| دکتۆری سستەمی هەرس | gastroenterologist |
| دکتۆری نەخۆشیەکانی خوێن | hematologist |
| دکتۆری نەخۆشیەکانی جگەر | hepatologist |
| دکتۆری گورچیلە | nephrologist |
| دکتۆری نەخۆشیەکانی هەناسەدان | plumonologist |
| ئەو دکتۆرەی چاوێلکە بۆ نەخۆش دەنوسێ | optometrist |
| دکتۆری ئاژەلان | veterinarian |

# پشکنینی پێویست لەکاتی نەخۆشیدا

لەکاتی بوونی هەر نەخۆشییەك لەم نەخۆشیانەی خوارەوە ، ئاماژە بەو پشکنینانە کراوە که پیوستن بۆ ئەو جۆرە نەخۆشیە پشکنینەکە بکرێت .

| ئەستوربوون | ژانی شان و مل |
|---|---|
| -CBC<br>-urea<br>-creatinine<br>-uric acid<br>-albumin<br>-sodium<br>-potassium<br>-calcium<br>-clore | -CBC<br>-Lipid profile<br>-ESR<br>-CRP |
| **زەردبوون (( زەردك ))** | **ئازاری جومگەکان** |
| -CBC<br>-GOT<br>-GPT<br>-Alk.phos<br>-HCV<br>-HBS<br>-T.S.B | -CRP<br>-RF<br>-ASO<br>-uric acid<br>-vit d3<br>-calcium<br>-CBC<br>-ESR |
| **زکچوونی درێژخایەن** | **پرۆستات** |
| -Na<br>-K<br>-Chloride<br>-CBC<br>-ESR | -PSA total<br>-PSA free |

| تێكچونی عادە | هەستیاری (( حەساسیە )) |
|---|---|
| -LH<br>-FSH<br>-prolactin<br>-progestron<br>-testosterone | -CBC<br>-IgE<br>-liver F.T |
| **شیر هاتن لە مەمك** | **دیاركردنی تالاسیمیا (( ثالاسیمیا ))** |
| -Prolactin | -CBC<br>-HB Electrophoresis |
| **خوێن شل بوون** | **تاو لەرز و ئارەقەكردن** |
| -PT<br>-PTT<br>-INR<br>-D.Dimer | -Widal<br>-brucella<br>-CBC<br>-ESR |
| **لەبارچوونی مندال** | **كەم خوێنی** |
| -Toxo<br>-Rubella<br>-CMV<br>-Chlamedia<br>-CBC<br>-ESR<br>-FBS | -CBC<br>-Ferretin<br>-Vit B12 |
| **ڕۆماتیزم** | **ووشكبونی دەم** |
| -ANA<br>Ds DNA | -Sugar<br>-HbA1C |
| **پرچ هەڵوەرین** | **زوو ماندوو بوون** |
| -CBC<br>-Ferritin<br>-zink<br>-Vit D3<br>-Vit B12<br>-Irone | -Ferritin<br>-CBC<br>-T3<br>-T4<br>-TSH |

| زیپکە | قەلەوبوون |
|---|---|
| -CBC<br>-GOT<br>-GPT<br>-AIK.Phos<br>-cholestrol<br>-Triglyceride | -T3<br>-T4<br>-TSH<br>-FBS<br>-HbA1C |
| **مووی زیاد لە (( ئافرەتان ))** | **لاوازبوون** |
| -Prolactin<br>-testosterone | -HbA1C<br>-T3<br>-T4<br>-TSH |
| **جەلتە دل** | **ژانە سەر** |
| -Cardiac enzyme | -CBC<br>-Lipid profile<br>-ESR<br>-CRP<br>-ESR |
| **هەوکردنی لەوزەتێن** | **گەرم بوونی پێ یەکان** |
| -CBC<br>-ESR<br>-A.S.O test<br>-CRP | -ESR<br>-CRP<br>-HbA1C |
| **ئازاری گورچیلە** | **تەنگە نەفەسی** |
| -GUE<br>-B.Urea<br>-serum creatinine | -T3<br>-T4<br>-TSH |
| **ئازاری سنگ** | **بێ هێزی** |
| -CBC<br>-ESR<br>-CRP<br>-LDH<br>-Cardiac enzyme | -CBC<br>-Ferritin<br>-T3<br>-T4<br>-TSH |

| ژانی گەدە | خەستی ((پەیتی )) خوێن |
| --- | --- |
| -H.Pylori<br>-GSE | -D-Dimer |
| | **زۆر ئارەقەکردن** |
| | -T3<br>-T4<br>-TSH |

# Medical terminology – زاراوە پزیشكیەكان

ووشە پزیشكیەكان لە (( پێشگر )) یان لە (( پاشگر )) یێك لەگەل ((رەگ)) ی ووشەكە ،
ووشەیەكی پزیشكی لێ دووست دەكرێت ،
75% ووشە پزیشكیەكان رەگەكەیان دەگەرێتەوە بۆ زمانی (( لاتینی )) و (( گریك )) .

**نموونە :**

Cardio = card دلْ

Pulmono = lung سییەكان

**تێبینی :** هەندێك كات دوو رەگ مانایان وەكو یەكە وەكو

Nephr = kidney

Ren = renal = kidney , Renal stone بەردی گورچیلە

**تێبینی :** هەندێك كات رەگی ووشە زیاتر لە دوو مانایان هەیە .

Scler رەقبوون = scleroses

Scler سپی

Cyst كیس = Renal cyst كیسی گورچیلە

Cyst میزلدان = cystitis هەوكردنی میزلدان

# Build medical words – دوورستبوونی ووشه پزیشکییەکان

**Prefix** - پێشگر

**Root** – ڕەگی ووشە

**suffix** - پاشگر

**چۆنیەتی دوورستکردنی ووشە**

| Myo | card | itis |
|---|---|---|
| ماسولکە | دڵ | هەوکردن |

ئەگەر بمانەوێت پێناسەی ووشەکە بکەین بە کوردی سەرەتا دەبێت لە (( پاشگرەکە )) دەست پێ بکەیت ، بە واتایەکی تر دەبێت (( پاشگرەکە )) ببەینە سەرەتای ووشەکە . نمونە

| Myo | card | itis |
|---|---|---|
| ماسولکە | دڵ | هەوکردن |

هەوکردنی ماسولکەی دڵ

ئـــــەم ووشانەی خـــــــوارەوە بـــە ئامرازێكی پەیوەندی (( combining vowel )) پێكەوە بەستراونەتەوە ، كە باوترینیان ئامرازی ئۆ (( o )) یە ، وە ئامرازی (( o )) هیچ مانایەكی نی یە بەلكو بۆ ئەوەیە كە ووشەكە بە ئاسانی لە دەم بێتە دەرەوە .

## Combining form – چی یە

واتە ڕەگی ووشەكە لەگەل ئامرازی پەیوەندی

**Gastro + o =** combining form

**Cardi + o =** cardio

**Hepat + o =** hepato

نمونە :

**Hemi col ectomy**

ڕەگ ئامرازی پەیوەندی پاشگر

لابردنی نیوەی قۆلۆن

**cardi o logy**

ڕەگ ئامرازی پەیوەندی پاشگر

خوێندن لەسەر دڵ

**تێبینی** هەر ووشەیەك كۆتایی بە پاشگری (( itis )) هات ، واتە هەوكردنی شوێنێك .

هەوكردنی بۆری هەوا **bronchitis**

**تێبینی** هەر ووشەیەك كۆتایی بە پاشگری (( logy )) هات واتە خوێندن لەسەر بابەتێك .

خوێندن لەسەر ئێسك **Ostology**

**تێبینی** هەر ووشەیەك كۆتایی بە پاشگری (( ectomy )) هات واتە لابردنی ئەندامێك یان نیوەی ئەندامێك .

لابردنی نیوەی قۆلۆن **Hemicolectomy**

## بنچینەی ووشە پزیشكیەكان Fundamental of medical term

بنچینەی ووشە پزیشكییەكان بریتی یە لە ڕەگی ووشە (( word root )) .

زۆربەی هەرە زۆری ڕەگی ووشەكان ناوی (( ئەندامێك )) یان (( كۆئەندامێك )) ی جەستەیە. وەكو

**Arthr** جومگە = **arthritis** هەوكردنی جومگە

**Heap** جگەر = **hepatitis** هەوكردنی جگەر

# prefix – پێشگر

پێشگر : پێشگرێکە دەچێتە سەرەتای ووشەکە و مانای ووشەکە دەگۆڕێت .

وە پێشگر دەکرێت دەلالەت بێت لەمانەی خوارەوە .

## 1. Number ژمارە

Momo = monoarthritis هەوکردنی جومگەیەك

## 2. Time کات

Post = postsurgery دووای نەشتەرگەری

## 3. Position شوێن

Sub ژێر = subcutaneous ژێرپێست

## 4. Color ڕەنگ

leuk سپی , leukocyte

## 5. Size قەبارە

Micro بچووك

Microorganism زیندەوەری بچووك

Microscopy ئامێرێکە بەکاردێت بۆ بینینی زیندەوەرە بچووکەکان

# پاشگر

پاشگر : پاشگرێکە دەکەوێتە کۆتایی ووشە و مانای ووشەکە دەگۆڕێت .

وە پاشگر دەلالەت لە پرۆسەیەکی نەشتەرگەری دەکات .

**1 . surgical procedure . (( ectomy ))** لابردن

Splenectomy لابردنی سپل

Hepatectomy لابردنی جگەر

**2. diagnosis** دەلالەت لە دۆزینەوەی نەخۆشی

Scopy بینین

Colonoscope ئەو ئامێرەی بەکاردێت بۆ بینینی قۆلۆن

**3. disease** دەلالەت لە نەخۆشی

Emesis ڕشانەوە

Hyperemesis ڕشانەوەی زۆر

کاتێك کە پاشگر (( suffix )) دەچێتە سەر ووشەکان ئامرازی پەیوەندی (( o )) بەکاردێت بۆ ئەوەی بە ئاسانی ووشەکە دەربڕدرێت ، بەلام لە هەندێك حالەتدا کە ڕەگی ووشەکە بە (( x )) کۆتایی هاتبێت ، دەبێت سەیری پیتی پێش (( x )) ەکە بکەین بزانین پیتەکە بزوێن یان نەبزوێنە .

- ئەگەر پیتی پێش (( x )) ەکە نەبزوێن بوو ، ئەوا پیتی (( x )) دەگۆڕین بۆ پیتی (( g )) پاشان پاشگرەکەی بۆی زیاد دەکەین .

Pharynx → pharyngitis
Larynx → laryngitis

- بەلام ئەگەر پیتی بزوێن هاتبێت پێش (( x )) .

پیتە بزوێنەکان بریتین لە مانە (( a – e – u – o – I )) .

لەم کاتەدا پیتی (( x )) دەگۆردرێت بۆ (( c )) پاشان پاشگری بۆ زیاد دەکەین .

هەوکردنی ڕیخۆلە کوێرە Appwndix ریخۆلە کوێرە = appendicitis

لابردنی ڕیخۆلە Appwndix ریخۆلە کوێرە = appendectomy

- هەندێك پاشگر هەن بە (( Rh )) دەست پێ دەکەن ، هەر کاتێك پاشگرێك بۆ ڕەگی ووشە زیاد بکرێت ، ئەگەر پاشگرەگە بە (( Rh )) دەستی پێ کردبوو ئەوا دەبێت (( R )) بکرێتە دەبڵ .

شلە هاتنە دەرەوە – ڕژاندن Rhea

هاتنە دەرەوەی ئاو لە لووت Rhino + Rhea = Rhinorrhea

Oto + Rhea = otorrhea

# پێشگرەکان Prefixes

پێشگرەکان : کۆمەلە ووشەیەکن یان پیتێکن ، دەکەونە پێش ڕەگی ووشە ، واتە دەکەونە سەرەتای ووشە و ، واتای ووشەکە دەگۆڕن .

## ئەو پێشگرانەی بۆ نەفیکردن بەکاردێن Negative prefixes

### نە ، بەبێ ، نەبوون ، هیچ (( a , an ))

**A**pnea کەسێك هەناسەی نەبێت

A = نەبێ

Pnea = هەناسە

**A**tony نەبوونی گرژی ماسولکە

A = نەبوون

Tony = گرژی

**A**febrile نەبوونی تا

A = نەبوون

Febrile = تا

**An**orexia نەبوونی حەزی خواردن

An = نەبوون

Orexia = حەزی خواردن

**An**aesthesia هەستنەکردن بە شتەکان

An = نەبوون

Aesthesia = هەستکردن

Anaerobic نەبوونی ئۆکسجین

An = نەبوون

Aerobic = ئۆکسجین

## (( anti )) against دژ

**Anti**viral دژی ڤایرۆس

Anti = دژ

Viral = ڤایرۆس

**Anti**hypertensive دەرمانەکانی دژی بەرزی پەستانی خوێن

Anti = دژ

Hypertensive = بەرزی پەستانی خوێن

**Anti**fungal دژی کەروو

Anti = دژ

Fungal = کەروو

## (( contra )) against بەرامبەر , دژ

**Contra**lateral دژی ئەو لایە

Contra = دژی

Lateral = لا

**Contra**ceptive دژی دووگیانبوون

Contra = دژ

Captive = حەمل

## (( in , im , ir )) not نەرێکردن

**In**correct ناڕاست – هەلە

In = نا

Correct = ڕاست

**In**visible نەبینراو

In = نە

Visible = بینراو

**In**adequate بڕێکی ناتەواو ، نەبوونی بڕی پێویست

In = نە

Adequate = بڕێکی تەواو

**In**compatible نەگونجان

In = نە

Compatible = نەگونجان

**In**fertile نەزۆك

In = نە

Fertile = كەسێك توانای وەچە خستنەوە هەبێت

**Im**perforation (( كەسێك كونی كۆمی نەبێت )) داخراو

Im = نە

Perforation = كونی كۆمی

**Ir**regular نارێك

Ir = نا

Regular = ڕێك , **ir**regular heart beat لێدانی دڵ نارێك

## (( non )) not نەرێكردن

**Non**specific تایبەتمەند نی یە ، شتێكی ناوورد

Non = نە

Specific = شتێكی وورد

## (( un )) not نەرێكردن

**Un**conscious كەسێك ئاگای لەخۆ نەبێت (( بێهۆش ))

Un = نی یە

Conscious = بەئاگا

**Un**safe سەلامەت نی یە

Un = نی یە

Safe = سەلامەت نی یە

## (( dis )) absence or removal نەهێشتن ، نەمان ، نەرێكردن

نەهێشتن یان لەناوبردنی وورده زیندەوەرەكان

**Dis**advantage زیانەكان

Dis = نە

Advantage = سودەكانی

## (( de )) remove or without نەبوون یان لابردن

**De**toxify لابردنی ژەهرەكان

De = لابردن

Toxin = ژەهر

**De**toxification لابردنی مادە ژەهراوی و زیان بەخشەكان

**De**congestant دژە ئاوسان

## ئەو پێشگرانەی دەلالەت لە (( قەبارەو & برِ )) دەکەن .

1. (( **macro** )) **large** گەورە

**Macro**organism ئەو زیندەوەرانەی بە چاو دەبینرێن

2. (( **micro** )) **small** زۆر بچووك

**Micro**organism ئەو زیندەوەرانەی بە چاو نابینرێن

3. (( **hyper** )) بەرز

Hypertension بەرزی پەستانی خوێن

4. (( **hypo** )) نزم

**Hypo**tesion نزمی پەستانی خوێن

5. (( **nulli** )) **non** هیچ

**Nulli**parous ژنێك كە هیچ مندالی زیندووی نەبوبێت

6. (( **hemi** )) **half or one side** نیوە یان لایەك

**Hemi**plegia شیفلیج بوونی لایەكی لەش یان نیوەی لەش

**Hemi**paresis بێزبوونی لایەكی جەستە

**Hemi**sphere نیوەگۆ

RT & LT hemisphere in brain نیوەگۆی لای راست و چەپی مێشك

7. (( **semi** )) **half** نیوە

**Simi**conscions نیو ئاگا

**Semi**circular نیوبازنە

## 8. (( mono – uni )) one or single یەك

Monoplegia ئیفلیج بوونی پەلێك

Monocyte یەك خانە

Uni lateral لایەكی لەش

Uni nuclear خانەی یەك ناوكی

## 9. (( primi )) first یەكەم

Primigravida یەكەم سكپربوون (( حەمل ))

## 10. (( bi & di )) two or twice

Bicuspid valve زمانی دووپەڕەیی

Biceps muscle ماسولكەی دووسەر

Bilateral هەردوو لای لەش

Disaccharide شەكری دووانی (( لاكتۆز ))

## 11. (( diplo )) double دوو

Diplopia بینینی شتەكان بە دوو شت

## 12. (( poly & multi )) many زۆر ، زیاتر لە دووشت

Polyarthritis هەوكردنی چەند جومگەیەك

Polyuria میزكردنی زۆر

Multicellular فرەخانەكان

Multi vitamin زۆر ڤیتامین

## 13. (( mega & megalo )) گەورە یان گەورەبون

Megacolon گەورەبوونی ریخۆڵە

## ئەو پێشگرانەی دەلالەت لە (( ژمارە )) دەکەن

**1. (( mono )) one یەك**

Monocyte یەك خانە

**2. (( bi )) two دوو**

Bicuspid valve زمانی دووپەڕەیی

**3. (( tri )) three سێ**

Tricuspid valve زمانی سێ پەڕەیی

**4. (( quadri & tetra )) foure چوار**

Quadriplegia ئیفلیج بوونی هەرچوار پەل

Quadriceps ماسولکەی چوارسەر

Tetraplegia ئیفلیج بوونی هەر چوار پەل

# ئەو پێشگرانەی باس لە (( شوێن & كات )) دەكەن

## 1. (( ante & pre )) before لەپێش ، پێشەوە

Anterior بەشی پێشەوەی لەش

Antecardium بەشی پێشەوەی دڵ

Antenatal پێش لەدایك بوون

Pre exam پێش تاقیكردنەوە

Precardium بەشی پێشەوەی دڵ

## 2. (( post & retro )) behind or back بەشی دوواوە ، پشت

Posterior بەشی دوواوەی لەش

Postcardial پشت دڵ

Postnasal پشت لووت

Retrosternal دوواوەی ئێسكی ستێرنەم

Retroocular دوواوەی چاو

## 3. (( end )) inner , inside ناوەوە

Endocarditis هەوكردنی بەشی ناوەوەی دل

Endoscopy هەناوبینی

## 4. (( intra )) into , inside , within ناوەوە یان لەناو

Intravenous ناو خوێنهێنەر

Intra abdomen infection هەوكردنی ناوەوەی سك

## 5. (( Ex & Extra )) out , outside دەرەوە

Exhalation هەناسە دانەوە

Exopthalmous چاوی بۆ دەرەوە هاتوە ، دەرپەرینی چاو

Extravascular hemolysis تێكشكانی خرۆكە سورەكان له دەرەوەی كۆئەندامی سوران له (( جگەر )) .

## 6. (( Ec & Ecto )) out , outside دەرەوە

Ectopic pregnancy سكپڕبوون له دەرەوەی مندالدان

## 7. (( Epi & supra )) over , upon سەرەوە

Epidermis چینی سەرەوەی پێست

Epigastric pain ئازار له سەرەوەی گەدە

Supraumbilical incision برین له سەرەوەی ناوك

Supraspinatous muscle بەشی سەرەوەی ماسولكە

## 8. (( infra & sub )) under , below ژێرەوە یان خوارەوە

Infraspinatous muscle ئەو ماسولكەیەی كەوتۆتە خوارەوەی ماسولكە

Infra orbital nerve ئەو دەمارەی لەژێر چاو دێتە خوارەوە

Subcutaneous ژێرپێست

## 9. (( dextro )) right لای ڕاست

Dextrocardia كەسێك دڵی له لای ڕاست بێت

**10. (( levo & sinistro )) left side لای چەپ**

Levocardia دڵی لە لای چەپە

Sinistrocardia دڵی لە لای چەپە

**11. (( inter )) between لەنێوان**

Intercostal space بۆشایی نێوان پەراسوەکان

Interscapular pain ئازاری نێوان دەفەی شان

**12. (( peri )) around چوواردەور ، دەوورووبەر**

Periumbilical pain ئازاری دەوروبەری ناوك

Periorbital edema ئازاری دەوروبەری چاو

**13. (( ipsi )) same side هەمان لا**

Ipsi lateral هەمان لا

**14. (( intra )) during لەوکاتەدا**

Intraoperative complication ئەو کێشانەی لەکاتی نەشتەرگەری ئەگەری ڕودانیان هەیە

# تەعقیم کردنی کەلوپەلە پزیشکییەکان

تەعقیم کردن (( sterilization )) کەلوپەلی پزیشکی بەم (( تیشك & گاز )) انەی خوارەوە تەعقیم دەکرێن ، وە زۆربەی مەوادەکان کە تەعقیم دەکرێن لەسەر کارتۆنەکانیان یان لەسەر نایلۆنەکانیان هێمایان بۆ کراوە ، سەیری وێنەی ژێرەوە بکە باسی هێماکان کراوە .

Sterilization by irradiation

تەعقیم کردن بە تیشك بەتایبەت (( تیشکی گاما ))

Sterilization by ethylene oxide

تەعقیم کردن بە گازی (( ethylene oxide ))

Sterilization by steam or dry heat

تەعقیم کردن بە (( هەلم یان گەرمی ووشك ))

Item has not been sterilized

تەعقیم نی یە

## چۆن بزانین کەلوپەلی پزیشکی بە چی تەعقیم (( sterilization )) کراوە

وەکو پیشتر ئاماژەمان پیدا لەسەر کارتۆنەکانیان هێمایان بۆ دانراوە سەیری وێنەکانی ژێرەوە بکە .

نوسراوە (( sterile R )) واتە بە تیشك تەعقیم کراوە .

ئەگەر سەیری وێنەی بەرامبەر بکەن نوسراوە (( sterilized by gamma Raddiation )) واتە بە تیشکی گاما تەعقیم کراوە .

ئەگەر سەیری وێنەی ژێرەوە بکەن دەبینن نوسراوە (( sterile EO )) واتە بە ئیثیلین ئۆگزاد (( ethylene oxide )) تعقیم کراوە

# تیشکەکان توانای تێپەربونیان بەناو چیدا هەیە

لەم وێنەی خوارەوە رونمانکردووەتەوە کە تیشکەکان توانای تێپەربونیان بەناو چیدا هەیە .

**تیشکی ئەلفا (( alpha ray ))**

توانای تێپەر بونی نی یە بەناو (( کاغەز ، فافۆن ، ڕساس ، دیوار و ئاو )) دا .

**تیشکی بێتا (( beta ray ))**

توانای تێپەڕبونی هەیە تەنها بەناو (( کاغەزدا )) .

**تیشکی (( x – ray )) ئەشیعە**

توانای تێپەڕبوونی هەیە تەنها بەناو (( کاغەز و فافۆن )) دا .

**تیشکی گاما (( gamma ray ))**

توانای تێپەڕبوونی هەیە بەناو (( کاغەز ، فافۆن )) دا .

**(( neutron ))**

توانای تێپەربونیان هەیە بەناو (( کاغەز ، فافۆن ، ڕساس )) دا .

# پشکنینی هەستیاری (( test )) بۆ دەرزییەکان پێش بەکارهێنانیان

پێش بەکارهێنانی هەندێك لە دەرزیەکانی وەکو (( ...... amoxicillin – cefetriaxone )) کە پێویستیان بە پشکنین هەیە دەبێت بەم شێوەیەی خوارەوە خالەکان لەبەرچاو بگیرێن .

١. شوێنی لێدانی دەرزی هەستیاری دەبێت (( ٥ بۆ ١٠ سم )) لە دیویی ژوورەوەی دەست لە خوارەوەی (( elbow )) ئەنیشك . کە دەکاتە (( ٤ پەنجە )) لە خوارەوەی ئەنیشك ، شوێنی لێدانی دەرزی هەستیاریەکەیە . چونکە پێستی دەست لەم شوێنە تەنك و ناسکە
٢. وا باشە بە پانتایی (( ٥ سم )) بازنەیەك لە شوێنی تێستەکە بکێشرێت . بۆ ئەوەی کە کەسەکە هەستیاری بە دەرزییەکە هەبوو لەو شوێنە بە روونی دیار دەبێت .
٣. بە سرنجی (( ئەنسۆلین )) (( ١٠ وەحدە )) (( unit )) لە دەرزییەکە وەردەگرین .
٤. لە شوێنی لێدانی دەرزییەکە دەبێت بە گۆشەی (( ١٠ پلە )) واتە (( intradermal )) دەرزیەکە لێ بدرێت .
٥. لەکاتی لێدانی دەرزییەکە دەبێت بە هێواشی لێ بدرێت .
٦. شوێنی لێدانی دەرزییەکە دەبێت ئەستوور بێت (( بئاوسێت )) وەکو وێنەی سەرەوە .

٧. نابێت بەهیچ شێوەیەك شوێنی لێدانی دەرزی تێست **مەساجی** پیٚ بكرێت ، چونكە لەكاتی مەساج پێكردن مادەی دەرزییەكە دەچێتە ناو شانە چەورییەكان .

٨. دەبێت نەخۆشەكە بۆ ماوەی (( ١٥ بۆ ٢٠ )) **خولەك** چاوەریٚ بكات ، چونكە لەو ماوەیەدا ئەگەر نەخۆشەكە هەستیاری بەو دەرزییە هەبێت دەردەكەوێت .

٩. چۆن هەستیاری دەناسینەوە ، شوێنی هەستیاری‌یەكە (( سور هەلدەگەڕیٚ ، پەلەی سور لەو شوێنە بەدەردەكەوێت ، شوێنەكە خورشتی دەبێت ( دەخورێت ) .))

# شێوازی لێدانی دەرزی ماسولکەی شان (( Deltoid ))

شێوازی لێدانی دەرزی ماسولکەی (( deltoid )) به شێوازی (( im )) واته (( intramascular )) ە و بەم شێوەی خوارە دەرزییەکە لێ دەدرێت .

١. دەبێت کەسەکە دەستی (( relax )) شل بکات ، بۆ ئەوەی لەکاتی لێدانی دەرزی ئازاری نەبێت .

٢. لە سەرەوەی شان ئێسکی (( acromion )) هەیە وەکو لە وێنەکەی سەرەوە دیارە (( ٤ پەنجە )) لە ژێرەوەی ئیسکی (( acromion )) شوێنی لێدانی دەرزییەکەیە .

٣. دەبێت دەرزییەکە بە گۆشەی (( ٩٠° پلە )) لە ژێرەوەی (( ٤ پەنجەکە )) بدرێت .

٤. بەهیچ شێوەیەك نابێت شوێنی دەرزییەکە **مەساجی** پیٛ بکرێت .

٥. نابێت (( **نیدلی دەرزییەکە** )) زۆر درێژ بێت .

# شێوازی لێدانی دەرزی ناو شانەی چەوری (( subcutaneous ))

بە دوو شێواز دەتوانرێت دەرزی (( subcutaneous )) ڵی بدرێت کە کورترتراوەکەی (( SC ))

## A. شێوازری لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ٩٠° )) پلە .

کاتێك بمانەوێت دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ٩٠° )) پلە ڵی بدەین دەبێت بە (( ٣ پەنجە )) پێست بەرز بکەینەوە ، دوواتر دەرزییەکە بە گۆشەی (( ٩٠° )) پلە واتە بە ستوونی ڵی بدرێت .

بەڵام لەکاتی لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ٩٠° )) پلە بەهیچ شێوەیەك نابێت هەموو پەنجەکانی دەستە بەکار بهێنین بۆ بەرزکردنەوەی پێست ، چونکە لەم حالەتەدا ماسولکەش لەگەڵ پێست و شانەی چەوری بەرزدەبێتەوە ، وە لە کاتی لێدانی دەرزی ئەگەری هەیە دەرزییەکە بچێتە ناو ماسولکە . سەیری وێنەی ژێرەوە بکە .

وە لەکاتی لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ٩٠° )) پلە دەبێت بە سرنجی ئەنسۆلین ڵ بدرێت ، یان ئەو سرنجانەی نیدلیان هاوشێوەی سرنجی ئەنسۆلینە .

سەیری وێنەی ژێرەوە بكە ،

لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ۹۰° )) پلە .

وە لەكاتی لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ۹۰° )) پلە دەبێت بە سرنجی ئەنسۆلین لێ بدرێت ، یان ئەو سرنجانەی نیدلیان هاوشێوەی سرنجی ئەنسۆلینە .

**B. شێوازری لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ٤٥° )) پلە .**

كاتێك بمانەوێت دەرزی (( subcutaneous )) بە گۆشەی (( ٤٥° )) پلە لێ بدەین ، ئەو كاتە پیوست بە بەرزكردنەوەی پێست نابێت ، بەلكو بە گۆشەی ٤٥° پەل دەرزییەكە لێ دەدەین .

سەیری وێنەی ژێرەوە بكە .

## شوێنەكانی لێدانی دەرزی (( subcutaneous ))

تێبینی : لەكاتی لێدانی دەرزی (( subcutaneous )) لە شان دەبێت لە ڕووی پشتەوە بدرێت چونكە لە ڕووی پێشەوە ماسولكەی (( deltoid )) ی لێیە . سەیری وێنەی ژێرەوە بكە .

# تعقیم كردنی (( سێت )) یان ئالەتی پزیشكی

تەعقیم (( sterile )) ئالەتە پزیشكیەكان ، دووای ئەوەی ئالەتەكە دەبێ جوان بشورێت و ووشك بكرێتەوە دوواتر لەناو نایلۆنێكی پزیشكی دادەنرێت كە پێی دەوترێت packaging paper سەیری وێنەی ژێرەوە بكە

سەیری وێنەی ژێرەوە بكە كە وێنەی (( packaging paper )) ە بە قیاسی جیاواز بەردەستن

# چۆن بزانین ئەو (( packaging paper )) بە چی تعقیم کراوە

(( packaging paper )) ەکان لە سەر لایەکانی نوسراوە کە دەتوانیت بە (( تیشك – گەرمی – هەڵم – گاز )) تعقیم بکرێن . وە لاکێشەیەکیشیان لەسەرە کە ڕەنگێکی هەیە دەلێت ئەو ڕەنگە دەگەۆڕێ بۆ ئەو ڕەنگە .

سەیری وێنەی ژێرەوە بکە .

واتە دەبێت بە هەڵم ئالەتەکە تعقیم بکرێ چونکە هەڵم توانای تێپەڕبونی هەیە بەناو ئەو جۆرە نایلۆنە کە پێی دەگوترێت (( packaging paper )) .

سەیری وێنەی دوواتر بکە کە چ گۆڕانکاری رووی داوە .

وێنەی پێش تەعقیم كردن

وێنەی دووای تەعقیم كردن

ئەگەر سەیری وێنەی سەرەوە بكەین دەبینین ئەو لاكێشە (( شینە ))ی سەرەوە گۆڕاوە بۆ (( قاوەیەكی )) تاریك وەكو ڕەش وایە . كەواتە (( pack )) لەم وێنەی سەرەوە پاكەكان تەعقیمن ئامادەن بۆ بەكارهێنان .

هەروەها زۆربەی (( packaging paper )) ەکان لە هەردوو لاتەنیشتی نوسراوە بە دوو شێوەی جیاواز واتە دەتوانین بە دوو جۆر تەعقیم بکرێت بۆ نمونە لەوانەیە لە نەخۆشخانەیەك تەنها ئەو ئامێرە بەردەست بێت کە بە (( هەلم )) ئامێرەکان تەعقیم دەکات ، کەواتە ئەگەر لەسەری نوسرابێت (( EO )) کە کورتکراوەی (( گازی ئیسیلین ئۆگزایدە )) ناتوانیت بە ئامێری (( steam )) هەلم ئالەتەکە تەعقیك بکرێت .

سەیری وێنەی ژێرەوە بکەن

**ئەگەر سەیری وێنەی سەرەوە** بکەن هەرچەندە وێنەکە ڕوون نی یە بەلام ڕوونی دەکەینەوە . لەلای دەستە چەپی ئێوە وێنەی لاکێشە (( شین )) ەکە دیارە . لە تەنیشتی نوسراوە (( **steam** )) واتە بە هەلم تەعقیم دەبێت وە ڕەنگە شینەکەش دەگۆڕێت بۆ (( **قاوەیەکی** )) **تاریك** . وەکو ڕەش وایە . پێشتریش ڕونکردنەوەمان لەسەر داوە .

ئەگەر سەیری لای دەستە ڕاستی خۆتان بکەن لە وێنەی پێشتر وێنەی لاکێشەیەکی ( پەمبە ))ی لەسەرە وە لە تەنیشتی نوسراوە (( EO - change to yellow ))

(( EO )) واتە (( ethylene oxide )) واتە بە گازی ئیسیلین ئۆگزاید تەعقیم دەبێت وە ڕەنگەکەش دەگۆڕێت بۆ زەرد .

کەواتە گرینگی ئەو (( packaging paper ))ە لەوەدایە کە دەشتوانرێت بە دوو ئامێری جیاواز ئالەتەکان لەناوی دابنرێن و کام جۆری تەعقیم بەردەست بێت لەو دووجۆرە دەتوانرێت پێی تەعقیم بکرێن .

سەیری وێنەکانی ژێرەوە بکە کە ئالەتەکات تەعقیم کراوان و ڕەنگەکەش گۆڕاوە

ئەگەر سەیر بکەن لەهەردوو وێنەکە ڕەنگی لاکیشەکە گۆڕاوە وەکو ڕەنگی ڕەشی لێ هاتوە

# کاتێك کە (( packaging paper )) بەردەست نەبێت

لە هەندێك لە نەخۆشخانەکان دا (( packaging paper )) بەردەست نی یە ، بەلام

(( paper )) وەرەقەیەکی تایبەت هەیە بۆ لەناو دانانی ئالەتەکان یان پارچە قوماشێك هەیە

سەیری وێنەکانی ژێرەوە بکە .

لەکاتی بەکارهێنانی ئەم جۆرە وەرەقەیە یان قوماشە دەبێت ئەم جۆرە **پلاستەرەی** لێ بدرێت کە تایبەت **بە تەعقیم** .

سەیری وێنەی ژێرەوە بکە .

ئەگەر تەرکز بخەنە سەر پلاستەرەکە دەبینن خەتی سپی تێدایە کە ئەو خەتە سپیانە دووای تەعقیم دەگۆڕێن بۆ ڕەنگی ڕەش ، بەوە دەناسرێتەوە کە ئەم سێتە تەعقیم کراوە

سەری وێنە دوواتر بکە .

وەکو دیارە هێلە سپییەکانی وێنەی سەرەوە گۆڕاون بۆ هێلی ڕەش لە وێنەی ژێرەوە .

## جۆرێکی تر بۆ ئەوەی کە بزانیت سێت (( تەعقیم )) کراوە یا خود نا

ئەم دوو وێنەی ژێرەوە کە دەبینین لە وێنەی یەکەم دیارە هێلە زەردەکە دەگۆڕێت بۆ هێلی ڕەش

وێنەی ١

وێنەی ٢

## لەکاتی تەعقیم کردنی (( سێت )) دەبێت ئەم دەستەواژانەی خوارەوە لەسەری بنوسرێت

١. ناوی ئەو کەسەی سێتەکەی (( دەبەستێتەوە )) .
٢. ژمارەی ئەو ئەدەواتانەی کە لەناو سێتەکەدان .
٣. بەرواری (( تەعقیمکردنی )) سێتەکە .

m

# medical abbreviation - كورتكراوە پزیشكییەكان

| كوتكراوە | ووشە | مانای كوردی |
| --- | --- | --- |
| RX | Treatmeant | چارەسەر |
| HX | history | مێژووی |
| DH | diagnosis | دەستنیشانكردن |
| Q | every | هەموو |
| qd | Every day | هەموو ڕوژێ |
| qod | Every other day | ڕۆژ نا ڕۆژێك |
| qh | Every hour | هەموو كاتژمێرێك |
| s | without | بەبێ |
| ss | On e half | یەك و نیو |
| C | with | لەگەل |
| sos | If needed | كاتی پیوست |
| Ac | Before meals | پێش خواردن |
| PC | After meals | دووای خواردن |
| BID | Twice a day | دوو جار لە ڕۆژێك ادا |
| TID | Thrice a day | سێ جار لە ڕۆژێك ادا |
| QID | Four times a day | چوار جار لە ڕۆژێك ادا |
| OD | Once a day | یەك جار لە ڕۆژێك ادا |
| HS | Bed time | كاتی نوستن |
| BBF | Before breakfast | پێش نانی بەیانی |
| Bt | Bed time | كاتی نوستن |
| TW | Twice a week | دووجار لە هەفتەیەكدا |
| SQ | Subcutanious | ناو شانەی چەوری |
| IM | Intra mascular | ناو ماسولكە |

| IV | intravinous | ناو دەمار |
|---|---|---|
| Q4H | Every 4 hoours | هەموو چوار کاتژمێر جارێك |
| QAM | Every morning | هەموو بەیانیان |
| QPM | Every night | هەموو شەوان |
| 1TSF | Teaspoon = 5 ml | ٥ مل |

# زاراوە پزیشکیەکان و مەبەستەکانیان

| مەبەستەکانیان | گروپەکانی دەرمان |
|---|---|
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەری هەستیاری | antihistamine |
| ئەو دەرمانانەی ئازار کەم دەکەنەوە . | analgesic |
| ئەو دەرمانانەی تا کەم دەکەنەوە یان تا ناهێڵن | Antipyretic |
| ئەو مادانەی پێست خاوێن دەکەنەوە یان التهلب کەم دەکەنەوە . | Antiseptic |
| ئەو دەرمانانەی بەکتریای زیانبەخش لە لەش دا لەناو دەبەن . | antibiotic |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ زیادکردنی ژمارەی خڕۆکە سورەکانی خوێن . | Antianaemia |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ نەهێشتنی دڵ تێکەڵاتن ( هێڵنج ) و ڕشانەوە . | Antiemetic |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ نەهێشتن یان کەمکردنەوەی ترشەڵۆکی گەدەیە . | Antiacid |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ کەمکردنەوە یان نەهێشتنی غازاتی ڕیخۆلە . | Antiflatulence |
| ئەو دەرمانانەی کە ڕێگری دەکەن لە گرژبوون و.بەتایبەت ماسولکە نەرمەکان . | antispasmodic |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی سنگە کوژێ و چارەسەرکردنی نیشانەکانی کەم ڕۆیشتنی خوێن بۆ دڵ . | antianginal |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ کەمکردنەوە یان | Antiarrhythmic |

| | |
|---|---|
| چارەسەرکردنی ناڕێکی ڕیتمی دڵ | |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی بەرزی پەستانی خوێن . | Antihypertensive |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی چەوری خوێن | Antilipemic |
| ئەو دەرمانانەی یارمەتی کەمکردنەوەی خوێن مەین دەدەن . | Anticoagulant |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی خەمۆکی . | Antidepressant |
| ئەو دەرمانانە خەو هێنەرن وادەکەن مرۆڤ بخەوێت . | hyponotic |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی دەروونی . | Antipsychotic |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی نیشانەکانی قەلەقی . | Antianxiety |
| ئەم دەرمانانە بەشێوەیەکی سەرەکی بەکاردێن بۆ نەخۆشی لەرزۆکی ( parkinsons ) . | Antiparkinson |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ ڕێگریکردن لە جەلتەی مێشك یان کەمکردنەوەی ئەو زیانانەی کە بە دەمارەکان دەگات دووای جەلتەی مێشك . | antistroke |
| ئەو دەرمانانەی یارمەتی جەستە دەدەن دژی ئەو ڤایرۆسانەی کە دەبنە هۆکاری نەخۆشی . | Anti viral |
| ئەو دەرمانانەی بەکاردێن بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سیل . | Anti – T.B |

# چۆنیەتی دەستنیشانکردنی ڕێژەی ٪ سەدی سوتان

دەستنیشانکردنی ڕێژەی سەدی سوتان بەپێی شوێنی جەستە دیاری دەکرێت کە لە سەرەوە ئاماژەی پێی دراوە . کە بەشی پێشەوەو دوواوەی جەستەیە ، وە ڕێژەی ٪ لەسەدای لەسەر جەستە نوسراوە .

چەند شوێنی جەستە سوتابێ بەیەکەوە کۆدەکرێنەوە و ڕێژەی سەدی دەردەچێت .

**نمونە :** ئافرەتێك لەكاتی چێشت لێنان بەهۆی ئاگرەوە بەشێكی جەستەی دەسوتێت كە بەشەكانیش ئەمانەن (( بەشی پێشەوەی قۆڵی ڕاستی ، دەم و چاوی . پشتی نیوەی سوتاوە )) چۆن بزانین لە سەدا ٪ چەند سوتاوە .

**وەلام :** سەرەتا ڕێژەی سەدی ئەو شوێنانەی سوتاوە دەنوسین و پاشان كۆیان دەكەینەوە .

- (( بەشی پێشەوەی قۆڵی ڕاستی = ٤.٥ % ))
- ((دەم و چاوی = ٤,٥ %))
- (( پشتی = ٩ % ))

٤,٥ + ٤,٥ + ٩ = ١٨ % واتە ئافرەتەكە سەدا (( ١٨ )) سوتاوە

## کتێبەکانم

### کتێبی یەکەمم

کتێبی وێنه یی پزیشکی

ئەم کتێبە ئاشناتان دەکات بە نــاوی ئەو ئامێروو ئـــالەتە زۆر گرنـــگانەی نـــاو نەخۆشخانە کە پیوستە ناوەکانیان بزانیت و وە بۆچیش بەکار دەهێنرێن

ئامادەکردنی . صلاح اسعد احمد

ناساندنی هەندێ ئامێرو ئالەتە
زۆر باوەکانی ناو نەخۆشخانە

### کتێبی دووەمم

## كتێبی سێیەم

## كتێبی چوارەمم

چەنالی هێزی پەرستار

لەم لینکەی خوارەوە دەتوانن لەگەلم بن کە بابەتەکانی ناو کتێبەکە بە شێوەی ڤیدیۆیی باس دەکەم

https://www.youtube.com/channel/UC55DVIOvQHGFtbbIgGbdTTA

